هیچ کارێکمان مابێت.تۆخۆت لەوەتێ دەگەیت کەجەنابت تەنها لەوەرزی کارکردندا لێرە کاردەکەیت، بەهەرحاڵ، ... هتد).

لەم بارەدا بەرەنجامی ئەوکارە بێ ئومێدبوونی کەسی بەرانبەر دەبێ.واهەست دەکات دابەزێنراوەتە خواری خوارەوە.چونکە زۆربەیان هەوڵیان بۆ بژێوی دەدا.بۆیە چیدی هیچ خۆشەویستیەکیان نامێنێ بۆئەو کارگەیەی کەلەسەر کارەکانیان دەری کردن.

دواجار بڕیارمدا بەشێوەیەکی جوانتر وشایستەتر مامەڵەبکەم لەگەڵ ئەوانەی تردا کەهێشتر لەلامان مابونەوە.بۆیە هەریەکیانم بەجیا بانگ دەکرد، پاش ئەوەی سەرنجی ووردم ئەدا لەوکارەی کەلەزستاندا کردبووی، ئەوجا پێم دەگوت: بەڕێز سمیس، جەنابت کارێکی زۆر جوانت کردووە(ئەگەر هەربەڕاستی کاری جوانی کردبێ).بەڵام کاتێ تۆ نێردراویت بۆ(بوئارک).کارێکی سەخت وناڕەحەت خرایە ئەستۆت.کەچی تۆبەوپەری ڕێکوپێکی کارەکانت ڕاپەڕاند.ئێمە حەزدەکەین بزانیت کەکۆمپانیاکەمان شانازی بەجەنابتەوە دەکات.تۆ فەرمانبەرێکی چالاکیت، کۆمپانیاکەمان بڕوای بە تۆ هەیە، هیوامان وایە بمێنێتەوە.ئەوەت لەیادنەچێت!).

ئەی بەرەنجامی ئەم شێوە ڕەفتارەچیە؟ فەرمانبەرەکان کەلەکۆمپانیا دێنەدەرەوە هەستیان زۆر لەوەباشترە کەهەست بە دەرکردن بکەن.هەست ناکەن دابەزێنرابنە خواری خوارەوە.چونکە دڵنیابوون لەوەی ئەگەرکارمان بمایە، دەستمان لێ بەر نەئەدان. هەرکاتێکیش کاری ترمان هەبوو، دەتوانن زۆر بەشادومانی وئاسایی بگەڕێنەوە بۆلامان.

دویت مورو، توانایەکی زۆر نائاسایی هەبووبۆ ئاشتکردنەوەی دووکەسی ناکۆك، ئەگەرچی لەوەشدابن دەست لەبینەقاقای یەکترگیربکەن.بەڵام چۆن؟ دویت، دەگەڕابەدوای لایەنەباشەکانی هەریەك

لەودوو کەسە ناکۆکەدا وباسی دەکرد... ناکۆکیەکەشیان لەسەرهەرچی بوایە، هیچکامیانی بەهەڵە لەقەڵەم نەئەدا.

پیاوە مەزنەڕاستەقینەکان. زۆرلەوەگەورەترن کاتیان لەوەدا بەفیرۆبدەن کەتەماشای سەرکەوتنەشەخسیەکانی خۆیان بکەن.بۆنمونە: لەساڵی ١٩٢٢دا، لەپاش چەند سەدەیەك لەدوژمنایەتیەکی تاڵ، تورکەکان بڕیاریاندا بۆهەتایە یۆنانیەکان لە ناوچەتورکیەکان دووربخەنەوە.

مستەفاکەمال لەبەردەم سەربازەکانیدا (وتارێکی ناپلیۆنی) دا... تیایدا گوتی: (دەریای ناوەڕاست ئامانجی ئێوەیە).لەم کاتەدا ئیدی یەکێك لەجەنگەسەختەکانی مێژوی نوێ هەڵایسا.تورکەکان تیایدا سەرکەوتن. لەئەنجامدا هەردوو سەرکردەنی یۆنانی (تریکوبیس) و(دایونیس) ڕوویان کردە کۆشکەکەی کەمال بۆخۆبەدەستەوەدان... تورکەکان خوازیاری ئەوەبوون نەفرەتەکانی ئاسمانیش دابەزێتە سەر دووژمنەدۆڕاوەکانیان، بەڵام ڕەفتاری کەمال ڕەهابوو لەهەستی سەرکەوتن.بۆیە دەستی هەردووسەرکردەکەی گرتوپێی گوتن: (فەرموودانیشن، لەوانەیە هیلاك بن) دوای ئەوەی بەووردی باسیان لە هێرشەکەکرد، قورسایی شکستەکەیانی لەسەر کەم کردنەوە، دروست وەك ئەوەی سەربازێ لەگەڵ سەربازێکی تردا بدوێ، پێی گوتن: (جەنگ یاریەکە، زۆرجار باشترین پیاوەکانیش تیایدا دەدۆڕێن).

تەنانەت لەترۆپکی سەرکەوتنیدا، کەمال ئەم ڕێساگرنگەی لەبەرچاوبوو: لێگەڕێ، ئاوی ڕووی خۆی بپارێزێ.